ناوی کتێب: مارکۆز و پۆپەر

وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی

بابەت: فەلسەفی

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

تیراژ: 1000 دانە

نرخ: 2000 دینار

ژمارەی سپاردن: 1411 ی 2008

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : دووەم ساڵی 2008

کوردستان -سلێمانی

www.serdam.net
www.serdam.info

## دەروازەیەك

هێربرت مارکۆز و کارل پۆپەر دوو گەورە بیرمەندی سەدەی بیستن، کە بەدرێژایی ئەم سەدەیە و تائێستاش کاریگەرییەکی دیاریان لەسەر ڕەوتی فیکری خۆرئاوایی هەبووە و هەیە. بەداخیشەوە دەتوانین بڵێین خوێنەری کورد لەبەر نەبوونی سەرچاوە بە کوردی لەسەر ئەم دوو کەڵەبیرمەندە (ئیدی چ لەڕێی وەرگێڕانی کتێبەکانیانەوە بێت، یان باس و لێکۆڵینەوە لەسەریان) ئاشنایەتییەکی وەهای بەفیکریان نییەو، وێنەیەکی گەرچی ناکاملێش بێت سەبارەت بەم دوو بیرمەندەی لا دروست نەبووە*. هەر بۆیە بەپێویستمان زانی بەکورتی و بەشێوەیەکی تێپەڕیش بێت لەم پێشەکییە بچووکەدا لەسەر جومگە سەرەکییەکانی فیکری ئەم دوو فەیلەسووفە بوەستین، تا هیچ نەبێ خوێنەر بەرلە خوێندنەوەی گفتوگۆکە زەمینەیەکی لا هەبێت و زیاتر بە بیرو بۆچوون و ئایدیاکانی ئەم دوو بیرمەندە ئاشنا بێت.

سەرەتا دەمەوێ ئەوە بڵێم ئەم گفتوگۆیە گەرچی لە ساڵی (1970)دا ئەنجام دراوە و لەوساشەوە تا ئێستا دەیان گۆڕانکاری بەسەر جیهان و فیکرو

فەلسەفەدا هاتووە" بەڵام لەڕاستیدا گفتوگۆکە تا هەنووکەش نەك هەر بەنیسبەت ئێمەی کوردەوە، بەڵکو بەنیسبەت خۆرئاواشەوە لەڕووی ئەو مەسەلەو گرفتانەوەی وروژاندونی هێشتا هەر زیندوێتیی خۆی پاراستووە، ئەمە جگە لەوەی هەر دوو ئەم فەیلەسووفە دوای ئەنجامدانی ئەم گفتوگۆیەش لەسەر هێڵە سەرەکیەکانی فیکری خۆیان ماونەتەوە، ئەو هێڵە سەرەکیانەی هەوێنی ئەم گفتوگۆیەیان پێکهێناوە. ئەوەتانێ (د. فوئاد زەکەریا) دەربارەی (مارکۆز) دەڵێت: ((ئەو مەسەلەیەی بەڕاستی جێی سەرنجە لە پێشکەوتنی فیکریی ئەم فەیلەسووفەدا، ئەوەیە گۆڕانکارییەکی وەهای بەسەر ئەو بیروڕا سەرەکیانەی خۆیدا نەهێناوە کە بەرلە جەنگی جیهانی دووەم خستونیەتە ڕوو، بەڵکو هاتووە و بەبێ گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بەسەر بارودۆخی نوێی پاش جەنگدا پراکتیکی کردوون)).

بەڵام وێڕای ئەمەش، ئەم هزرە کە بنچینەکانی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چارەکە سەدەیەك بەر لە پراکتیککردنی، زیندووێتی و شیاویی خۆی سەلماندووە و توانیویەتی ببێتە سەرچاوەی ئیلهامی ملیۆنەها لاو، هەروەکو ئەوەی خاوەنەکەی یەکێك بێت لەوان و، پەی بە هەست و سۆزیان بردبێت و بە زمانی ئەوان بدوێت.(1)

هەروەها کارل پۆپەر خۆیشی لە ساڵی (1986)دا وتوویەتی: ((بەخشداری ئەم کتێبەم داوای لێ کردبووم تا یاداشتێکی کورت بنووسم و مەسەلەکەش

بریتیبوو لەوەی ئایا من تائێستاش هەمان بیرکردنەوەی ساڵی (1969م) هەیە، واتە کاتی نووسینی ژیننامەکەم" بەتایبەتیش کە ئەوکات نووسیومە من کامەرانترین فەیلەسووفێکم تائێستا هەبووبێت. ئەم پرسیارە ئاماژە بۆ ئەو گەشبینییەی من دەکات، بۆ ئەو بڕوایەی من کە ئێمە لە دونیایەکی سەیروسەمەرەدا دەژین. ئەم بڕوایەی من بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار مەحکەمتر بووە. من باش دەزانم زۆر شت لە جیهانی خۆرئاوادا هەن نادروستو هەڵەن، بەڵام هێشتا لەوە بێگومانم ئەم جیهانە باشترین جیهانێکە تائێستا هاتۆتە ئاراوە)).(2)

## هێربرت مارکۆز:

هەرکە باس لە شۆڕشی قوتابیان لە هاوینی ساڵی (1968)دا لە پاریس دەکرێ، ڕاستەوخۆ ناوی فەیلەسووفی ئەڵمانی (هێربرت مارکۆز) مان دێتەوە یاد" کە بە باوکی ڕۆحیی ئەو شۆڕشە دەژمێردرێ. ئەو شۆڕشەی دەکرێ بڵێین تائێستاش مرۆڤی ئەوروپایی و ژیاری ئەوروپایی قەرزارین. لەڕاستیدا ئەمە حەقیقەتێکە و نکوڵی لێ ناکرێ کە ڕۆڵی مارکۆز و فەلسەفەکەی لەسەر نەخشەی فیکریی خۆرئاوا و ژیاری خۆرئاوا ڕۆڵێکی دیار و ئاشکرایە. فەلسەفەی مارکۆز فەلسەفەیەکی ڕەخنەییەو بە یەکێك لە بیرمەندانی (قوتابخانەی فرانکفۆرت) دەژمێردرێ و ڕۆڵێکی کەمتری لە (ماکس

هۆرکهایمەرو تیۆدۆر ئادۆرنۆ) نەبینی لە داڕشتنی ئەو تیۆرە ڕەخنەییەی قوتابخانەی ناوبراو پێی ناسراوە. فیکری ڕەخنەییش لای مارکۆز کۆمەڵێك بنچینە و بنەمای فەلسەفیی هەیە و هەر لە سەرەتای ژیانی فیکرییەوە کەوتە ژێر کاریگەریی کۆمەڵێك فەیلەسووفی وەکو هیگڵ و مارکس (بەتایبەتیش نووسینە سەرەتاییەکانی) و نیچە و هایدیگەر و هەروەها ڕێبازە دەروونشیکارییەکەی فرۆید، بەڵام مارکۆز بەو بنەما فەلسەفییانەی ئەمانەوە ناوەستێت، بەڵکو گەڕانەوە بۆ ئەم فەیلەسووف و بیرمەندانەو وەرگرتن لێیانەوە بە دیدگایەکی فەلسەفیی تایبەتیی مارکۆزدا تێدەپەڕن و لە ئەنجامدا تیۆرییەکی فەلسەفیی ڕەخنەیی نوێ دادەڕێژێت کە بە ڕەخنەگرتن لەوان و لە کۆمەڵگای تەکنۆلۆژیی نوێ کۆتایی دێت. (ئەرکی تیۆریی ڕەخنەیی -لای مارکۆز- شیکردنەوەی مرۆڤ و جیهانەکەیەتی لە چوارچێوەی بوونە کۆمەڵایەتیەکەیدا نەك شیکردنەوەی لەمیانی کۆمەڵێك چەمکی فەلسفیی ڕەها "موتڵەق" ەوە)(3)

هەر بۆیە ئەو باوەڕی وابوو دەکرێ کۆمەڵگایەکی خاڵی لە چەپاندن و سەرکوتکردن بێتە ئاراوە تیایدا مرۆڤ ئازاد بێت و غەریزەکانی تێر بن و لە کۆت و بەندەکانی کار ڕزگاری ببێت، بەڵکو لە تەواوی ئەو کۆت و بەندانەی کۆمەڵگای تەکنۆلۆژیی هەنووکەیی لەبەردەمیدا قوتی کردوونەتەوە. بەبڕوای مارکۆز چ لە وڵاتە سەرمایەدارەکان و چ لە وڵاتە سۆسیالیستەکان

(بەتایبەتیش یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو)دا کۆمەڵگایەکی تەکنۆلۆژیی تاکڕەهەند هاتۆتە ئاراوە و بەپێی پلانێکی ئەقلانیانەی دارِێژراو، لەلایەن دەسەڵاتە حوکمدارەکانەوە مرۆڤی هاوچەرخ دەچەپێنرێ. لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا (مرۆڤی هاوچەرخ بەناوی -ئەقڵ-ەوە کۆیلە دەکرێ، هەمان ئەو ئەقڵەی لە جیهانی سەرمایەداریدا بەرهەم ڕێکدەخات و دابەشی دەکات، لەبەرئەوەی ئەم کۆیلەکردنەش پشت بە ئەقڵ دەبەستێ و پەیوەستە بەو گەشەسەندنە ئابوورییەوە کە خەسڵەتی کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکانە" بۆ یەکەمجار لە مێژووی بەشەریەتدا ئەم کۆیلەکردنە سیمایەکی پەسەندکراو بەخۆیەوە دەبینێ و، بەڵکو کۆیلەکردنێکە هەر قوربانییەکانی خۆی بەرگریی لێ دەکەن. (4) لەم کۆمەڵگایانەدا هەموو مرۆڤەکان دەبن بە مرۆڤی تاکڕەهەندو دەبنەوە بە هێزێك بۆ زیاتر سەقامگیرکردنی ئەو سیستەمەی لەئارادایە و لەم ڕووەشەوە سیستەمەکان هێند لەیەك جیاواز نین و (بەهەشتەکەی سۆڤیت لە دۆزەخەکەی ئەمریکا بە بەزەییتر نییە). بەجۆرە مرۆڤەکان دووچاری (نامۆبوون- اغتراب) دێن و دەبنە ئامێرێك بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانەی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات. (پلانیش جۆرە ڕێکخستنێکە لە سەرەوە بەسەر هەموو تاکێکدا دەسەپێنرێ و جۆرە ئیرهابێکی نەبینراوە کە بەرامبەر هەموو پیادە دەکرێ. بەهێزترین وسیلەشە بیروکراتە ئابووری و سیاسیەکان بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا پیادەی

دەکەن و ناهێڵن تاکەکان ڕاستەوخۆ بەرهەمی خۆیان بەجۆرێك ڕێك بخەن هەست بە بەری ڕەنجی خۆیان بکەن[5].

لە کۆمەڵگای تاکڕەهەندا بوارێك بۆ بەختەوەری و ئازادیی ڕاستەقینەی مرۆڤ نامێنێتەوەو ئەو دیموکراسی و ئازادیەی لەگۆڕێدایە چ نییە دیموکراسی و ئازادییەکی ڕووکەش نەبێ و (دیسپلینی کۆمەڵایەتیی پشتبەستوو بە تەکنۆلۆژیا دەگاتە ئاستێکی بەرز لە کۆنترۆڵی نەك بەتەنها هێزەکانی بەرهەمهێنان و بەس، بەڵکو هزرو هەست و سۆز و بەها و غەریزە سێکسیەکانی خەڵکیش)[6]، بەڵام ئاخۆ ئەو کۆمەڵگا ئاڵتەرناتیڤەی مارکۆز خوازیارێتی چ جۆرە کۆمەڵگایەکە و بە چ ڕێگەیەك وەدی دەهێنرێ؟!

هەروەکو ئاماژەمان پێ دا کۆمەڵگای تەکنۆلۆژیی هاوچەرخ لای مارکۆز کۆمەڵگایەکی تاکڕەهەندەو زادەی ژیارێکی چەپێنەرە. ژیارێکە پشت بە زۆریی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی دەبەستێ، بەڵام بەبێ ئەوەی مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایانە بپرسێت زۆریی بەرهەمهێنان بۆ کێ و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی لەپێناوی چیدا؟ لەڕاستیدا سیستمی دەسەڵاتدار لەم کۆمەڵگایانەدا لەپێناوی مانەوەو درێژەدان بەو سیستمە" بەرهەمهێنانو پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیی کردۆتە ئامانج نەك وەسیلەیەك بۆ باڵایی ژیانی و بەختەوەرکردنی مرۆڤ. ئەو زۆریی بەرهەمهێنانە بۆ لابردنی چەپاندن لەسەر مرۆڤنەبووە، بەڵکو

بەپێچەوانەوە بۆ زیاتر چەپاندنی بووە. هەر بۆیە ئەو ژیارەی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ هێناویێتیە بەرهەم ژیاری کاری قورس‌و چەپاندنە نەك ژیاری "ئیرۆس". ئیرۆسیش لای مارکۆز چەمکێکی فراوانتری لە چەمکە باوەکەی هەیەو واتە (گەڕانەوە بۆ سەرچاوە زیندووەکانی مرۆڤ و، چێژوەرگرتن لە غەریزەو ئەقڵ پێکەوەو، وەدەستهێنانەوەی ئەو خۆشەویستیەی کۆمەڵگای پیشەسازیی هاوچەرخ ئەفەرۆزی کردووە، یان سووك و دزێوی کردووە.[7]

بەڵام چۆنێتیی بەدیهێنانی کۆمەڵگای ئیرۆس لای مارکۆز (کە تەوەری گفتوگۆکانی ئەم کتێبەیە) و ئایا لەڕێی شۆڕشەوە دەبێ دەستەبەر بکرێ؟ یان لەڕێی ریفۆرمەوە؟ ئەوا ئەم پرسیارە دەهێڵینەوە بۆ خوێنەر خۆی، تا لە زمانی مارکۆز خۆیەوەو لەم گفتوگۆیانەوە پێی بگات.

## کارل پۆپەر

ئەم فەیلەسووفە ناوی (ئەقلانییەتی ڕەخنەگرانە)ی لە فەلسەفەکەی نابوو. یەکێك بوو لەو فەیلەسووفانەی بەردەوام پرسیاری تازەی لە بواری زانستدا دەوروژاند. ئەو لەو باوەڕەدا بوو هیچ ڕاستییەك (تەنانەت ڕاستیی زانستیش) نییە قابیلی بەدرۆخستنەوە نەبێ و پێویستە ئەقڵ هەمیشە عەودالی حەقیقەت و گەڕان بەدوا حەقیقەتدا بێت و لەم ڕووەشەوە باوەڕی وابوو ڕێگایەکی

میانڕەوانە لەنێوان شێوازی پۆزەتیڤیستی و شێوازی نیسبیگەرا بە گوماندارەکاندا هەیە.

پۆپەر دەیوت: "ناتوانین زانست و حەقیقەت بە یەك شت لەقەڵەم بدەین، چونکە ئێمە وایدەبینین هەم تیۆرەکانی نیوتن سەر بە زانستە و هەم تیۆرەکانی ئینشتاین، ناشکرێ هەردووکیان دروست و ڕاست بن، بەڵام دەشێ هەردووکیان نادروست و درۆ بن"[8].

لێین پۆپەر فەیلەسو

# تیزەکان

**هێربرت مارکۆز:**

کۆمەڵگای سەرمایەداریی هەنووکە دەوڵەمەندترین و پێشکەوتووترین کۆمەڵگایە لە مێژوودا. ئەم کۆمەڵگایە گەورەترین و واقعیبینانەترین ئیمکاناتی بوون لەگەڵ ئاشتی و ئازادیدا بۆ مرۆڤ دەخاتەڕوو، یان پێویستە بیخاتەڕوو. لە هەمانکاتدا کۆمەڵگایەکە بەکاریگەرترین شێوە ئیمکاناتی ئاشتی و ئازادی سەرکوت دەکات. ئەم سەرکوتکردنە لەسەر کۆمەڵگا ئەمڕۆ شێوەیەکی سەراپاگیری بەخۆوە گرتووە، هەر بۆیە تەنها لەڕێی گۆڕانکارییەکی ڕیشەییەوە دەتوانرێ بونیادی کۆمەڵگا بگۆڕرێ.

**کارل پۆپەر:**

لە هەموو ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیانەدا کە لێیان بەئاگاین، ناعەدالەتی، سەرکوتکردن، هەژاری و بێدەرەتانی هەبووە. سیستمە دیموکراتەکانی ڕۆژئاواش لەم حاڵەتە بەدەر نین، بەڵام لای ئێمە دژی ئەم نەخۆشیە خەبات دەکرێ. من

لەو باوەڕەدام لە سیستمی دیموکراسیی خۆرئاوای ئێمەدا ناعەدالەتی و سەرکوتکردن و هەژاری و بێدەرەتانی لە هەر کۆمەڵگایەکی تر لەو کۆمەڵگایانەی دەیانناسین، کەمترە. سیستمە کۆمەڵایەتیە دیموکراتیەک و خۆرئاواییەکانی ئێمە، هێشتا زۆر ناکامڵن و پێویستیان بە ڕیفۆرم هەیە، بەڵام لە هەموو ئەو سیستمانەش باشترن کە تا ئێستا هەبوون. پێویستە پەلە لە ڕیفۆرمدا بکرێ، بەڵام دەشێ ترسناکترین هزری سیاسی ئەو هزرە بێت کە خوازیاری کامڵکردن و بەختەوەرکردنی مرۆڤە، هەوڵدان بۆ وەدیهێنانی بەهەشت لەسەر زەوی، هەمیشە بۆتە مایەی دروستکردنی دۆزەخ بۆی.

## ژياننامەی (سياسی)ی هيربرت مارکۆز

من لە بەرلين لەدايك بووم و، لەبەر هەر هۆيەك بێت (دەشێ لەبەرئەوە بێ کە بەرلينييەکان گاڵتەچين، يان هەر هۆيەکی دی) تائەمڕۆش من ئەوەم پێ خۆشە لەوێ لەدايك بووم، بەڵام لەڕاستيدا ئەزموونەکانی مـن لـە سـاڵی (1918)ەوە، واتە لەگەڵ شۆڕشـی ئەڵمانيـدا دەسـتی پـێکردووە، سـاڵی (1918) بۆ ماوەيەکی کورت ئەندامی ئەنجوومەنی سەربازان بووم لە بەرلين، ڕاينيکندۆرف. کاتـێ بـێ هـيچ مـەرجێك ئەفسەرانی دەرەجـەداريان لـەم ئەنجوومەنە وەرگرت، من وازم هێنا. پاشان بەچاوی خۆم شکستی شۆڕشم لە بەرلين بينی، هەم خيانەت لە شۆڕش کـراو هـەم سەرکوتيـشيان کـرد. لـە بەرلينەوە چووم بۆ (فرايبۆرگ) تا لەوێ بخوێنم، لەنێوان ساڵانی (1928-1932)دا تاقە جارێك نەبێ کە سەرگەرمی کاسبييەك بووم زۆر سـوودی نەبوو، ئيدی ئەو ماوەيە قوتابيی هۆسێرل و هايديگەر بووم.

پ/

**ئێوە ئەو ڕۆژانە پەیوەندییتان بە هیچ ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستیەوە نەکرد، بۆچی؟**

مارکۆز/

پەیوەندیم بە هیچ ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستیەوە نەکرد و، ئەگەر لێم بپرسن بۆچی، گەرچی مایەی نەنگییە، بەڵام دەبێ دانی پیا بنێم و بڵێم: وەڵامێك بۆ ئەوە شك نابەم. زۆر بەسادەییەوە دەڵێم نازانم بۆ.

کاتێ لە بەرلینەوە بۆ فرایبۆرگ چووم ساڵی (1919) بوو. ژیانم لە فرایبۆرگ لە سیاسەت خاڵی بوو. دواتریش وەختێ بۆ بەرلین گەڕامەوە، لێکترازان کەوتبووە ڕیزەکانی حیزبی کۆمۆنیستەوە، دەستی بێگانە، دەستی ڕووس بەئاشکرا لەوەدا دیاربوو، کە من هێندە بەهۆی بەرەوپێشبردنی کارم دانەدەنا. لەوانەیە یەکێك لە هۆیەکانی دوورەپەرێزیی منیش ئەوە بووبێت، بەڵام ئەو کاتانە تا دەهات سیاسیتر دەبووم. دیاربوو فاشیزم بەڕێوەیە، ئەمەش هانی دام دەست بە خوێندنەوەیەکی قووڵی مارکسو هیگڵ بکەم. کەمێك درەنگتر نۆرەی خوێندنەوەی فرۆیدیش هات. هەموو ئەمانەش بەو مەبەستە بوو تێبگەم لەڕاستیدا بۆچی کاتێ بەتەواوی هەلومەرجی شۆڕشگێڕانەی ڕەسەن لەئارادابوو" ئەو شۆڕشە تێك شکا، یان سەرکوت کرا؟ دووبارە هێزە کۆنەکان هاتنەوە ڕوو و تەواوی بارودۆخەکە بەشێوەیەکی خراپتر سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوە. ساڵی (1933)- لەوانەشە کانوونی یەکەمی (1932) بووبێت-

سەفەرم کرد. هەر لەو ڕۆژانەدا لەلایەن دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتییەوە کە هۆرکهایمەر بەڕێوەی دەبرد، دەعوەتنامەیەکم پێگەیشت. سەرەتا ساڵێك لە سویسرا بووم و پاشان لە حوزەیرانی (1934)دا بەرەو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چووم، لە زانکۆی کۆڵۆمبیا بوومە مامۆستا و دواتر لە ساڵی (1940)دا هاتمە واشینگتۆن تا لە ڕۆژگاری جەنگدا لەوێ کار بکەم و چیم پێ دەکرێ و ئەوەی لەتوانامدایە بیخەمەگەڕ، تا لە شکستهێنان بە ڕژێمی نازیدا بەشداربم.

پ/

**ڕەخنەگران سەرزەنشتی هاوکاریی ئەو ڕۆژانەی ئێوە دەکەن لەگەڵ دەزگای جاسووسی ئەمریکا OSSدا. باشە لەوێ چیتان دەکرد؟**

**مارکۆز/**

من ڕاڤەکارو شیکەرەوەی مەسەلە سیاسیەکان بووم، بەشێك لە OSS کە من کارم تیایدا دەکرد، جۆرە دەزگایەکی لێکۆڵینەوە بوو. ئەرکی توێژینەوەی گۆڕانکارییە سیاسیەکانی ئەو وڵاتانە بوو کە لە جەنگدا بەشدار بوون. من لێپرسراوی ئەوروپای مەرکەزی بووم. هەر ڕەخنەگرێك ئەمە بۆ من بە خەوشێك بژمێرێ، نیشانەی نەزانییە، چونکە ئەوە لەبیردەکەن کە ئەو ڕۆژانە مەسەلە شەڕی دژ بە فاشیزم بوو! منیش خۆم بە شەرمەزار نازانم لەم شەڕەدا

بەشداریم کردووە، ئەوەش بڵێم پاش جەنگیش من هەر لە واشینگتۆن مامەوە. هۆی سەرەکیش لەوەدا ئەوە بوو هاوسەری یەکەمم نەخۆشیی شێرپەنجەی هەبوو، لەبەرئەوە نەماندەتوانی سەفەر بکەین، لەو ساڵانەدا - نزیکەی (1945 تا 1949) لە چەند دەزگایەکدا سەرگەرمی کار بووم، تیایاندا منو هاوڕێکانم چەندمان لەتواناادا بووایە تەخسیریمان نەدەکرد تا دژ بە سیاسەتێك بوەستینەوە کە بەشێوەیەکی بەرچاو دژایەتیی کۆمۆنیزمی دەکرد. هەمدیسان لەوانەیە ڕەخنەگرانی من ئەوەیان لەبیر چووبێتەوە کەلەو ساڵانەدا شاڵاوەکانی ماکارپی ڕێك ئاراستەی ئەو گروپە کرابوو کە لە وەزارەتی دەرەوەدا بوون. نەك لەبەرئەوەی ئەو گروپە ناسیونالیستی بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی -بەبڕوای ئەو- کۆمۆنیستی بوو. تەنها دوای جەنگ توانیم سەرقاڵی چالاکیەکی بەرنامەداری فێرکردن بم، سەرەتا لە زانکۆی براندیس و پاشان لە زانکۆی کالیفۆرنیا لەسان دیاگۆ. لە ساڵانی دواتریشدا لەدوای (1963 - 1964)ەوە فەلسەفەی من، کردەوەم تا دەهات ڕادیکالتر دەبوو. چونکە وا دەهاتە بەرچاوم خەریکە ئەزموونی کۆن دووبارە دەبێتەوەو، سیاسەتیش لەم وڵاتەدا زیاتر لە جاران بەرەو ڕاسترەویەکی توند دەڕوات، دیموکراسی ڕوو لە ئاوابوونە. تابێ سەرکوتکردنی کەمایەتیەکان زیاتر دەبێ. سیاسەتی دەرەوە ڕوو لە دوژمنایەتیکردنەو خۆی لە (جەنگی بچووکتر)دا دەبینێتەوە، بیرم لەوە دەکردەوە ئەو کارەی وەکو ڕۆشنبیرێك لەدەستم دێ دەبێ ئەنجامی بدەم تا

بەپێچەوانەی ئەو تەوژمە کار بکەم. هەر ئەمەش ڕۆڵێکی لە بزاڤی قوتابیاندا بە من بەخشی. ئەو ڕۆڵەی تا ئەمڕۆش، هەرچەند بەڕادەیەکی کەمتر-دوابی لەم بارەیەوە دەدوێم- لەئەستۆمدایە. ساڵی (1969) داوای درێژکردنەوەی کارم لە زانکۆدا نەکرد، چونکە لە سەرەتاوە دەمزانی قایـل نـابن. سـاڵی (1969 - 1970)، یان ڕاستتر لە (1968 - 1969)دا بەردەوامنامەم پێ دەگەیشت، تیایدا هەڕەشەی کوشتنیان لێ دەکردم. دواتر بەهۆی مەسەلەکەی ئەنجیلا دیڤیسەوە ژمارەی ئەو نامە هەڕەشە ئامێزانە زیاتر بوو، بەڵام من نیازم وایە هـەر لێـرە بمێنمـەوەو لەسـەر کـاری خـۆم بـەردەوام بمو ئـەوەی لەتوانامدایە بینووسمو ئەنجامی بدەم.

## ژیاننامەی (سیاسی)ی کارل پۆپەر

لـە سـالّی (1915)دا، وەختــێ تـەمــەنم (13) سـالاّن بـوو، بـووم بـە مارکسیستو سالّی (1919) کە هێشتا حەڤدە سالّیم تەواونەکردبوو، بووم بە ئەنتی مارکسیست، بەلاّم تا بووم بە سی سالاّنیش هەر سۆسیالیست بووم، گەرچی لە جاران زیاتر بەگومانم لەوەی ئازادی و سۆسیالیزم بتوانن لەگەلّ یەکدا بسازێن.

بەسەرهاتێك رۆلّێکی دیاریکەری لـەوەدا هـەبوو مـن بـووم بـە ئـەنتی مارکسیــست، ئــەو بەســەرهاتەش لــە ڤیــەننای زادگامــدا روویــدا، لــە خۆپیشاندانێکدا کە کرێکارانی لاوی سۆسیالیستو کۆمۆنیست سازیان دابوو تەقەکراو چەند کرێکارێکی لاوی تێدا کوژرا. زۆر رقم لە پۆلیس هەلّسا و، هەروەها لە خۆشم، چونکە هەستم دەکرد منیش وەکو مارکسیستێك بەجۆرێك لە جۆران لەو بەدبەختییەدا بەشدارم. لەبەرئـەوەی تیـۆری مارکسیـستی خوازیاری شەڕی چینایەتییە. بە لافی مارکسیزم شـەڕی چـینایەتی چـەند

توندوتیژتر بێ، ئەوەندە زووتر دەگەینە سۆسیالیزم و، گەرچی شۆڕش پێویستی بە قوربانیدانە، بەڵام قوربانییەکانی ڕۆژانەی دەست سەرمایەداری زۆرترن، گەلێ زۆرتر لە هی شۆڕشی سۆسیالیستی، ئەمە بۆچوونی مارکسیزمە.

من لە خۆم پرسی ئایا بەڕاستی دەتوانین شتێکی لەم جۆرە بزانین و لێی دڵنیا بین؟! بە دیدێکی ڕەخنەییەوە دەستم بە خوێندنەوەی مارکس کرد و، لە ئەنجامدا پەیم بەوە برد باوەڕی مارکسیزم بە سیستمی کۆمەڵایەتیی حوکمڕان و بەدسروشت، باوەڕ بەوەی سەرمایەداری ڕوو لە نەمانەو هاتنی سۆسیالیزم پێداویستیەکی مێژووییە، باوەڕێکی چەند بێ بناغەیە.

ئەوەی لەڕاستیدا بوونی هەبوو، مرۆڤ بوو، بە ئازارو شادمانییەکانییەوە. من بەم مانایە فەردگەرایەك بووم، لام ڕوون بوو دەبێ عەدالەت لەنێوان فەردەکاندا بەرپا بێت. چەمکی وەك مرۆڤایەتی، یان چین چەمکی ئەبستراکت (مجرد)ن و دەشێ هەندێ جار زۆر خەتەرناك بن.

دەبێ چی بەو مارکسیستانە بڵێین کە ئامادەن لەپێناوی ئاسوودەیی مرۆڤایەتیەکی ئەبستراکتدا قوربانی بەکۆمەڵێك کەسی زیندوو بدەن؟ ئەوانە لەو بڕوایەدان تا ڕۆژگار و بارودۆخی خەڵك خراپتر بێ، هەلومەرج بۆ شۆڕش و هەروەها بۆ مرۆڤایەتی ڕەخساوتر دەبێ. هەڵبەتە ناکۆکیەکی فرەش لەنێوان بۆچوونەکانیاندا هەبوو، بەڵام زۆر جێی نیگەرانییش بوو کە ئایا توندوتیژیی

ئەم ناکۆکیانە زەمینە بۆ کۆمەڵگایەکی باشتر سازدەکات، یان بۆ کۆمەڵگایەکی خراپتر، بۆ نموونە کۆمەڵگایەکی فاشیستی.

ڕەخنەگرتنی من لە مارکسیزم سەرەتا بە هیچ جۆرێك باوەڕی منی بە سۆسیالیزم لەق نەکرد. لای من سۆسیالیزم دروشمێکی ئەخلاقی و بیری دادپەروەری بوو. سیستمێکی کۆمەڵایەتی کە تیایدا هەژاریی فرە و سامانی فرە هەیە لای من سیستمێکی ناعادیلانەیە و قابیلی بەرگەگرتن نەبوو، بەڵام وەختێ زیاتر لە جاران تێگەیشتم سۆسیالیزمی دەوڵەتی دەوڵەت سست دەکات و بیرۆکراتەکان بەرامبەر بە هاووڵاتیان دەسەڵاتدار دەکا، دەستبەرداری باوەڕی سۆسیالیستیم بووم. ئیدی لەو دەمەوە بڕوام بەوە نییە سۆسیالیزم لەگەڵ ئازادیدا هەڵدەکا. تەمەنم (28) ساڵ بوو لە ڤیەننا بە مامۆستا دامەزرام، ئەو کاتە نووسینم زۆر بوو، بەڵام هیچم بڵاونەکردبۆوە. بە هاندانی هاوڕێیانم دوو کتێبم نووسی. دووەمیان کە ناوی (لۆژیکی توژینەوە) بوو لە ساڵی (1934)دا بڵاوبۆوە. بەم کتێبە ڕەوتی ژیانی زانکۆییم دەستپێکرد، ئەو ڕۆژانە لە نەمسا دیکتاتۆرێکی فاشیست حوکمڕان بوو، جگە لەوە لام ڕوون بوو ئەوەندە نابات هیتلەر نەمسا ناچار دەکات لەگەڵیدا ببێ بە یەك. لەبەرئەوەی بە ڕەگەز جوولەکەم بڕیارم دا وڵات جێبهێڵم. ئەو کتێبەم بووە هۆی ئەوەی لە بەریتانیاوە دەعوەتنامەیەکم پێبگات تا بچم لەوێ دەرس بڵێمەوە. سەری ساڵی (1936) بۆ وانەوتنەوە بۆ نیوزلەندە بانگهێشت کرام. وەختێ لەوێ لە

ئاداری (1938)دا هەواڵی هێرشەکەی هیتلەرم بۆ سەر نەمسا بیست" بڕیارم دا ئەو کتێبەم کە ناوی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی)ەو ڕەخنەگرتنە لە فاشیزم و مارکسیزم بڵاو بکەمەوە.

لە بەهاری (1945) دا لە نیوزلەندەوە بۆ بەریتانیا بانگهێشت کرام. لە (1946 تا 1969) لە زانکۆی لەندەندا دەرسم وتەوە. هەر لەنێوان ئەو ساڵانەدا وەکو مامۆستای میوان لە ئەمریکا و ماوەیەکی کەم لە نەمسا و لە ژاپۆن و لە ئوسترالیادا وانەم وتۆتەوە، هەر لە (1969)دا خانەنشین بووم. ئەم ڕۆژانەم وەك دەڵێن دەبێ ڕۆژانی ئاسوودەیی بێت، بەڵام لە جاران شەکەتترم.

# ڕەخنە و بەرنامە

## هێربرت مارکۆز: کۆمەڵگای نوێ

دەڵێن، تەنانەت ئەم قسەیەشیان خستۆتە پاڵ من، گوایە کۆمەڵگای سەرمایەداریی فرە پێشکەوتووی هەنووکە و بەتایبەتیش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کۆمەڵگایەکی فرەچین نییە و، جیاوازی و ناکۆکیی نێوان هەژار و دەوڵەمەند کەمتر بووە و، ململانێی چینایەتی ئەسڵەن لەئارادا نییە و ڕژێم(ی باڵادەست) توانیویەتی ئەو ناکۆکیانەی مارکس دۆزیونیەتیەوە، نەیانهێڵێت، یان سستیان بکات.

ئەمانە ناوترێن و منیش شتی وام نەوتووە. ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو ناکۆکیانە، واتە ناکۆکیەکانی ناوەوەی سیستمی سەرمایەداری هەر ماون. ئەو ناکۆکیانە ئێستا بەشێوەیەکی توندوتیژ، زۆر توندوتیژتر لە جاران خۆیان لەو ناکۆکییە گشتیەدا دەبیننەوە کە لەنێوان سامانی زۆری کۆمەڵایەتی —کە لەتوانایدا بوو ژیانێکی خاڵی لە هەژاری و خاڵی لە کاری نامۆ بە سروشت

دەستەبەر بکات-و شێوازی سەرکوتکەرانە و وێرانکەرانەی بەکارهێنان و دابەشکردنی ئەو سامانە کۆمەڵایەتیەدا هەیە. تەنانەت ململانێی چینایەتیش هەر ماوە، بەڵام هێشتا شێوەیەکی ئابووریی پەتی بەخۆوە گرتووە، داوای کرێی زیاتر، داوای چاککردنی هەلومەرجی کار، ئەو داوایانەی هێشتا دەتوانرێ لە چوارچێوەی سیستمی سەرمایەداریدا بهێنرێنەدی، گەرچی بەدیهێنانیشیان لەو چوارچێوەیەدا دابین کراوە، بەڵام هەروەکو لە مانگرتنە گەورەکانی ئەم ساڵانەی دواییدا و لە هەڵئاوسانی ئابووریدا دەبینین، بەردەوام دژوارتر دەبن.

لە سەرێکی ترەوە ڕاستە کۆمەڵگای سەرمایەداریی هەنووکە جیاوازیی گرنگی لەگەڵ سەردەمانی ڕابوردوودا هەیەو، ئەم جیاوازییانەش خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کە من ناوم ناوە تواندنەوە (گرتنەخۆ- احتواو)ی زۆرینەی چینی کرێکاران لەو سیستمەدا کە هەیە. ئەو تواندنەوەیەی بەهەرحاڵ لە بەرزترین شێوەیدا دەمەوێ لە سنووری کۆمەڵگای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دیاریی بکەم.

ئەم تواندنەوەیەی چینی کرێکار جاری وایە دەگاتە ئەو ڕادەیەی دەتوانین چینی کرێکار بە پاڵپشتێکی ئەو سیستمە لەقەڵەم بدەین- بەتایبەتیش لە ڕابەرایەتیی ڕێکخراوەکانی کرێکارانداو، کاتێ مەسەلەکە پەیوەندی بە پارێزگاریکردن لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە دەبێ- بەڵێ ئەم تواندنەوەیە بەتەنها تواندنەوەیەکی ڕووکەشانە یا ئایدۆلۆژیانە نییە. هۆی ڕوونی هەیە.

لەبەرئەوەی سەرمادارییی هەنووکە توانیویەتی لەسەر بنچینەی زۆریی بەرهەمهێنان ئاستی ژیانی زۆربەی خەڵك بەرزبکاتەوە. ئەمڕۆ باری زۆربەی کرێکاران، بەتایبەتیش کرێکارە پسپۆڕەکان لەچاو ڕابوردوودا زۆر باشتر بووە. بەشێکی زۆریان لە پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگای بەرخۆردا بەشدارن و، شتێکی مەنتیقیشەو ناشتوانین ناوی لێبنێین دەرزیەکی ڕاگەیەندنانە یا (مێشکشۆری) کە ئەوان نایانەوێ ئەو دەسکەوتە نسبیانە لەپێناوی ڕێگەکەی تردا واتە سۆسیالیزمدا لەدەست بدەن، ئەو سۆسیالیزمەی -ئەگەر بمانەوێ ڕێك و تەواو بێ- (یۆتۆپیا)یە، یان ئەو خەسڵەتانەی بەخۆوە گرتووە کە ئەمڕۆ لە یەکێتیی سۆڤێت و وڵاتانی هاوشێوەی ئەو دەیبینین. دەبێ ئەوەش بڵێین لەسەر بنچینەی فرەبوونی بەرهەمی کارو گەشەسەندن و کەڵەکەبوونی بەردەوامی کاڵا، هوشیارانە یان ناهوشیارانە ئادەمیزاد دستەمۆ دەکەن و چۆن و بۆ چ ئاراستەیەك بیانەوێ پەلکێشی دەکەن. ئەمانە بە نیسبەت سەرمایەدارییی هەنووکەوە بوون بە یەکێك لە ئامرازە پێویستیەکانی چاودێریکردن. واتە دەبێ بەردەوام پێداویستیی تازە، تەنانەت پێداویستییە غەریزیەکان بوروژێنرێن، تا هانی مرۆڤەکان بدرێ بۆ کڕینی ئەو کاڵایانەی بەردەوام بەرهەم دەهێنرێن! قەناعەتیان پێ بهێنرێ ئەوان بەڕاستی پێویستیان بەو کاڵایانە هەیە و، ئەو کاڵایانەش لەڕاستیدا ئەو پێداویستیانە دابین دەکەن. لە ئەنجامدا مرۆڤەکان دەبنە کۆیلەیەك بۆ پەرستنی بتەکانی کاڵا (فیتیشیزم)و

بەجۆرە تەنانەت لە پێداویستیەکانی خۆشیاندا سەرلەنوێ سیستمی سەرمایەداری بەرهەم دەهێننەوە. کالاکان دەبێ بکڕێن، چونکە ئەوانی تریش دەیکڕن، چونکە پێداویستی بۆ ئەو کالایانە بەشێوەیەکی کردەیی بزوێنراوە و بێدارکراوەتەوە.

ئەمەش مانای وایە دەبێ پارەی ئەو کالایانە پەیدا بکرێ و، لەبەرئەوەی بەردەوامیش گرانتر دەبن. دیسانەوە ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ ململانێ و تەقەللا بۆ بوون لەڕاستیدا بەردەوام توندوتیژتر دەبێ، ئەمە لە کاتێکا ئەگەر کار و سامانی کۆمەلایەتی بەشێوەیەکی ئەقلانی دابەش بکرێ، لەتوانادا هەیە ئەو ململانێیە بەجۆرێك پێشتر نەبووە خاو بکرێتەوە و ئاسان بکرێ، بەلام لە کۆمەلگای سەرمایەداریی هەنووکەدا ئاراستەکە بەپێچەوانەی بوونی ڕاستەقینەی خۆیەوەیەتی و وێڕای فرەیی سامانی کۆمەلایەتی، ململانێ لەپێناوی بووندا دژوارتر دەبێ نەك ئاسانتر. تواندنەوەی کرێکاران بەردەوامە. بەلام وەکو وتم، بە بۆچوونی من ئەم تواندنەوەیە ڕوو لە لاوازییە.

بەبڕوای من ئەمڕۆ ناکۆکیی ناوەکیی بەهێزتر لەپار ڕێی خۆیان دەکەنەوە، تەنانەت (وەك ئەلێن) لەناو چینەکانی ناوەند -بۆرژوازی-یشدا بەردەوام ئەم هۆشیاریە ڕوو لە گەشەکردنە بەوەی کۆمەلگای بەرخۆر- یان وەك پێی دەلێن کۆمەلگای بەرخۆر- و ئەو خۆشگوزەرانییەی لە کۆمەلگای بەرخۆردا هەیە، دەبێ نرخێکی زۆر گرانی بۆ بدرێ. ئەمەش نەك تەنها بەو کارە نامرۆییانەیەی

PDF 4 KURD

ڕۆح و جەستەش دەکوژێ، بەڵکو بەو کارەی سەنعەتی تەواو میکانیزەکراو و هەندێ جاریش ئوتوماتیك داوا دەکات. بۆ نموونە کاتێ کرێکار دەبێ هەشت سەعاتی ڕێك بەردەوام بورغوویەك بابدات، یا پەنجە بە دوگمەیەکدا بنێ و یان پارچەیەك بدات بەدەم پارچەیەکی تـرەوە. ئەگـەر بـیر لـەوە بکەینـەوە کـە لەڕاستیدا ئەمڕۆ ململانێی لەمجۆرە لەپێناوی بووندا پێویست نییە و سەرنجی ئەو سامانە کۆمەڵایەتیە بدەین کە هەیە و ئەوەش ڕەچاو بکەین کە دەکرێ بەشێوەیەکی ئەقلانی سوود لەو سەرچاوانە وەربگیرێ و دابەش بکرێ و دەکرێ زۆربەی ئەو جۆرە کارانە لابردرێن و بگۆڕدرێن بۆ کاری بەحەز و ئارەزوو، ئەوسا نرخی زۆر گرانی ئەو چالاکیانە دەزانین ڕۆح و جەستە دەکوژن، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش لەبەرچاو بگرین بەشێکی زۆری ئەو پارەوپوولەی لە کۆمەڵگای بەناو بەرخۆردا شێتانە بەفیڕۆ دەدرێ، دەتوانرێ بۆ ئامانجە پەلەکان، واتە لەناوبردنی هـەژاری و کـوێرەوەری کـە هێـشتا لـەنێو کۆمـەڵگای فـرە پێـشکەوتووی سەرمایەداریدا هەر بەربڵاوە و بەردەوامیش لە بڵاوبوونەوەدایە، تەرخان بکرێ.

لایەنێکی تریش کە گرانیی ئەو نرخە دەسەلمێنێ بۆ کۆمەڵگای بەرخۆر دەدرێ، ئەم ڕاستیەیە کە تابێ بەشێوەیەکی زەقتر خۆی دەنوێنێ: سەقامگیری و خۆشگوزەرانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بە زەرورەت بە شەڕی کۆلۆنیـالیزمی نـوێ و هـەژارکردن و وێرانکردنـی بەشـێکی زۆری جیهـانی سێیەمەوە بەستراوەتەوە. ئەمەش ڕەخنەیەکە لە کۆمەڵگای بەرخۆر کە تا

ئەمڕۆش ڕاستی و دروستیی شیکردنەوەی مارکس بۆ ئەو کۆمەڵگایە دەسەلمێنێ. کە هەڵبەتە بەشێك لە چەمکە سەرەکیەکانی مارکسیش، بەتایبەتی چەمکی پرۆلیتاریا، دەبێ بە جۆرێکی دیکە بنووسرێتەوە.

بەرگرییەکی دیکە لە کۆمەڵگای فرە پێشکەوتووی سەرمایەداری کە لە یەکەم نیگادا زۆر گرنگ دێتە پێش چاو ئەوەیە دەڵێن ئەم کۆمەڵگایە دیموکراسی دەستەبەر دەکاو، هەرچۆنێك بێ تارادەیەکی زۆر پرنسیپی پلورالیزم (فرەچەشنی) دەپارێزێ. باشە شتێکی بەڵگەنەویستەو دەبێ دانی پیا بنێین- چونکە ئەمە ڕاستییە- کە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا هێشتا ئازادی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زیاترە لە وڵاتێکی وەکو یەکێتیی سۆڤیێت و، هەروەها بێگومان لە دیکتاتۆریەتە فاشیستی و نیمچە فاشیستیەکان کە لە هەموو شوێنێکی دونیادا قوت بوونەتەوە. لە سەرێکی ترەوە نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت ئەو دیموکراسیە تا چەند دیموکراسیەکی دەستێوەردراو و سنووردارە.

لەڕاستیدا گروپێکی ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە لە جیهاندا شك نابەین بەجۆرێك خاوەن دەزگاکانی ڕاگەیاندن بێ و لەبەردەستیدا بێ. بۆ نموونە ڕۆژنامەیەکی ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە، وەك ئەوانەی کە لە فەڕەنسا یا ئیتالیادا دەردەچن نییە، چەپەکان، چەپە ڕادیکالەکان ئەسڵەن ڕێیەکی شایستە بۆ ئامرازەکانی ڕاگەیاندن شك نابەن، چونکە ئەو پارەیەیان نییە تاوەکو گروپەکانی دیکە ماوەیەك لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ بکڕن.

چەپەکان لەم دیموکراسیەدا هەر لە سەرەتاوە بەشخوراون. وابزانم ئەوەش ڕاستییەکی ئاشکرایە کە پرۆسەی سیاسی و دیموکراتیك تەنها بۆ هەردوو حیزبە گەورەکە، واتە دیموکرات و کۆماریخوازان پاوان کراوە، کە هەردووکیان لەڕووی ئامانجەوە چوونیەکن، هەربۆیە دیموکراسیەکی ڕاستەقینە کە لە چین و توێژەکانی خوارەوە سەرچاوەی گرتبێ، لەئارادا نییە.

ئەم ڕەوتە، کە دیموکراسی لەڕاستیدا لەنێوان حیزبە فەرمانڕەواکان خۆیاندا دابەش دەکرێ کە لە بنەڕەتدا و لە ئامانجیشدا چوونیەکن، گەرچی لە ئەمریکادا زیاتر لە هەر شوێنێکی دیکە پیادە کراوە، بەڵام بەبڕوای من دەتوانین لە ئەورووپاش هەمان‌بار ببینینەوە، بەتایبەتی لە بەریتانیا و لە ئەڵمانیای فیدراڵدا.

پ/

**بەهەرحاڵ نموونەی ئەو کۆمەڵگایە کامەیە کە ئێوە وەکو ئاڵتەرناتیڤێك بەرامبەر بە کۆمەڵگای هەنووکەی دادەنێن؟**

**مارکۆز/**

بەڵێ، مەسەلەی نموونەیەك بەرامبەر بە کۆمەڵگای هەنووکە هەمیشە لای من سادە خۆی نواندووەو ئەمڕۆش هەر سادە خۆی دەنوێنێ. ئەوەی ئەمڕۆ خواستی لاوانە، کۆمەڵگایەکی بێ جەنگ، بێ چەوساندنەوە، بێ سەرکوتکردن، خاڵی لە هەژاری و زێدەڕۆیی و پارە بەفیڕۆدانە. هەرچۆنێك بێ،

کۆمەڵگای پیشەسازیی پێشکەوتووی ئەمڕۆ هەموو ئەو سەرچاوە تەکنیکی و زانستی و سروشتیەی لەبەردەستدایە بۆ بنیادنانی کۆمەڵگایەکی لەو چەشنە پێویستە. ئەوەی لەبەردەم ئەم ئازادبوونەدا بۆتە لەمپەر، سیستەم (یا ڕژێم)ی باڵادەستو لایەنگرەکانێتی، کە بۆ بەرگریکردن لێی شەو و ڕۆژ کار دەکەن و لەم پێناوەشدا بەردەوام شێوازی توندوتیژ بەکاردەهێنن. خستنەڕووی نموونەیەکی دی بەرامبەر بە کۆمەڵگای هەنووکە لای من شتێکی دژوار نییە، بەڵام ئەوەی ئایا ئەو کۆمەڵگایە بەشێوەیەکی دیاریکراو دەبێ چۆن بێت، ئەمەیان مەسەلەیەکی دیکەیە، بەڵام بە باوەڕی من لەڕێی قەلاچۆکردنی هەژاری و نەهێشتنی بەرخۆری و سامان بەفیڕۆدان و ڕێگرتن لە وێرانکردنی سەرچاوەکانەوە، دەتوانرێ شێوەیەك لە ژیان دەستەبەر بکرێ، کە تیایدا مرۆڤەکان دەتوانن بەڕاستی بوونی خۆیان دیاری بکەن.

پ/

**ئەو ڕێگایەی دەمانگەیەنێتە ئەم کۆمەڵگایە چۆنە؟**

**مارکۆز/**

ئەو ڕێگایەی دەمانگەیەنێتە ئەم کۆمەڵگایە ڕێگایەکە بەتەنها لە کاتی خەبات لەپێناوی ئەو کۆمەڵگایەدا بەرجەستە دەبێ. ئەوەی دەتوانین لەم بارەیەوە بیڵێین ئەوەیە بەپێی جیاوازیی وڵاتەکان، ڕێگاکانیش گەلێ لە یەکدی جیاواز دەبن" بەگوێرەی پلەی کاملبوونی ئەو وڵاتانە، کاملبوونی هێزە

بەرهەمهێنەرەکان، کامڵبوونی هۆشیاریی سیاسی، نەریتی سیاسی و هتد...
دەمەوێ سەبارەت بە ئەمریکا قسە بکەم، چونکە لە هەموو شوێنێکی دی باشتر شارەزای ئەم وڵاتەم. دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەم دۆخەکە لە فەڕەنسا و ئیتالیادا زۆر جیاوازە. هەڵبەتە لێرەدا پرسیارێکیش دەربارەی بکەری ئەو گۆڕانکاریانە دێتەپێشەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا بکەری شۆڕش (شۆڕشگێڕ) کێیە؟ بەلای منەوە ئەم پرسیارە مەعقول نییە، چونکە بکەری شۆڕش بەتەنها لە پرۆسەی خودی گۆڕانکاریدا پەروەردە دەبێ. شتێك نییە بەسادەیی بوونی هەبێ و لە شوێنێکدا پەیدا بکرێ. بکەری شۆڕش لەمیانی کاردا پەیدا دەبێ، لە کامڵبوونی هوشیاریدا، لە کامڵبوونی کاردا.

پ/

**ئایا ئەمڕۆ چینی کرێکار دەتوانێ ڕۆڵی ئەو بکەرە ببینێت؟**

**مارکۆز/**

ڕەخنەیان لە من گرتووە گوایە وتوومە چیدی چینی کرێکار بکەرێکی شۆڕشگێڕانە نییە. هەڵبەتە ئەمە هەڵگێڕانەوەی قسەی منە. ئەوەی من وتوومە ئەوەیە ئەمڕۆ چینی کرێکار لە ئەمریکادا بکەرێکی شۆڕشگێڕانە نییە. ئەمە پێشداوەرییەك نییە لەلایەن منەوە، بەڵکو بە بڕوای من ئەمە خستنەڕووی ڕاستییەکە. دیسانەوە دەیڵێمەوە دۆخەکە لە فەڕەنساو ئیتاڵیادا تەواو جیاوازە. لەو وڵاتانەدا کە نەریتێکی کرێکارانەی بەهێز هەیە، هێشتا

ئاستی گوزەران نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی ئەمریکاو هەر لەبەرئـەوە هێـزی یاخیبوونی چینی کرێکار لە هی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆرزیاترە.

پ/

**ئێوە هەمیشە جەختێکی زۆرتان کردۆتەسەر ڕۆڵی قوتابیان. ئایا قوتابیان لە گۆڕینی کۆمەڵگادا چ ڕۆڵێکیان دەبێ؟**

**مارکۆز/**

من هەرگیز نەموتووە گوایە بزووتنەوەی قوتابیان ئەمڕۆ وەکو هێزێکی خۆڕسکی شۆڕشگێڕ جێگرەوەی بزووتنەوەی کرێکارانە. من وتوومە بزوتنەوەی قوتابیان ئەمڕۆ ڕۆڵی زەمینە خۆشـکەر بـۆ ڕای بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕانە دەبینێ. لەڕاستیدا ئەمە بۆ ئەمڕۆ ڕۆڵێکی زۆر دیاریکـەرە. بـەبڕوای مـن هەموو ئەو پروپاگەندە ڕوخێنەرانەی دەڵێن ئەو بزووتنەوەیەی لـە سـنووری زانکۆو قوتابخانەکان تێناپەڕێت ناتوانێ ببێت بە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەو، بەتەنها وەکو بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیرانە- بزووتنەوە بەو مانایەی دەستەبژێر بەکاری دەهێنێت- دەمێنێتەوە، ئەم پروپاگەندانە بەسادەیی بەلای ڕاستیەکاندا تێدەپەڕن. واتە ئەو ڕاستییە فـەرامۆش دەکـەن کـە ئەمڕۆکـە لـە زانکـۆو قوتابخانەکاندا بەڕێوەبەرانی کۆمـەڵگای ئاینـدە پـەروەردە دەکرێنو، هـەر لەبەرئەمـەش کـامڵبوونی هوشـیاری، هوشـیاریی ڕەخنـەیی، لـە زانکـۆو قوتابخانەکاندا ئەرکێکی چارەنووسسازی هەیە.

پ/

**ئایا ئەمڕۆ شۆڕش لە چییەوە سەرهەڵدەدا؟ چونکە لەوە ناچێ ئیدی لە هەژارییەوە سەرچاوە بگرێ، لانی کەم لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا؟**

**مارکۆز/**

ئەمە مەسەلەیەکە بەپێی وڵاتە جیاوازەکان دەگۆڕێ. لەو وڵاتانەدا کەهەژاری تیایاندا باڵادەستە بێگومان هەژاری ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ. لە وڵاتانی تردا نەو. دەشێ سروشتی دیاریکەری شۆڕشی سەدەی بیست، یان بیستو یەك سەرەتا وا دەرکەوێت لە هەژارییەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو لە نائینسانیەتەوە، لە بێزاری، لە سامان بەفیڕۆدان (ئیسراف)و فرەییەوە بەو مانایەی لە کۆمەڵگای بەرخۆردا باوە، لە ڕقهەڵسان، لە دڵڕەقی و ستەمو نەزانی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. هەر لەبەرئەمەش خواستی سەرەکیی ئەم شۆڕشە بۆ- یەکەم جاریش لە مێژوودا- ئەمە دەبێ: ئامادەکردنی بوونێك کە بەڕاستی شایانی مرۆڤ بێتو، بیناکردنی شێوەیەکی تەواو تازە لە ژیان. کەواتە مەسەلەکە بەتەنها گۆڕانێکی چەندێتی (کمی) نییە، بەڵکو گۆڕانێکی چۆنێتی (کیفی)یە.

پ/

**شۆڕشێك کە لە زۆرکردنو بێزارییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئایا ئەمە تێزێکی نامارکسیانە نییە؟**

**مارکۆز/**

بەهیچ کلۆجێك نامارکسیانە نییە، چونکە بێزاری خۆی هۆی بابەتی و کۆمەڵایەتی زۆر بەهێزی هەیە. بێزاری خۆی نیشانەی ناکۆکییە، ناکۆکییەك بەردەوام لەزیادبووندایەو بەسەر سەرتاپای کۆمەڵگای سەرمایەداریدا زاڵە. واتە ناکۆکیی نێوان سامانی کۆمەڵایەتیی مەزنو بەکارهێنانی خراپو وێرانکەری. هەمان ئەم ناکۆکییەیە وەختێ ئاستی هوشیاری بەرز دەبێتەوە، لە شێوەی (بێزاری لە کۆمەڵگا)دا بەرجەستە دەبێ.

**پ/**

**جەنابی پرۆفیسۆر، ئایا ناتوانین لە ڕای ڕیفۆرمەوە کۆمەڵگایەکی مرۆڤدۆستو ئازاد بەدیبهێنین؟**

**مارکۆز/**

ئێمە دەتوانینو دەبێ ڕیفۆرم تاقی بکەینەوە. دەبێ هەموو ئەو ڕێگایانە تاقی بکەینەوە کە لەتوانایاندایە هەژاری و بێدەرەتانی و تاسانن نەهێڵن، بەڵام چەوساندنەوەی ئابووری و سەرکوتکردن بە خودی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییەوە بەندە. هەروەك چۆن جەنگ و مەرکەزیەتی دەسەڵاتی ئابووریش بە خودی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییەوە پەیوەستە. ئەمەش بەو مانایە دێ درەنگ، یا زوو دەگەینە خاڵێك تیایدا ڕیفۆرمەکان لەگەڵ سنوورەکانی ڕژێمی بالادەستدا پێکدا دەدەن. واتە کاتێ ئامانجی ئەو ڕیفۆرمانە

بڕینی بنجو بناوانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری واتە (قازانج) دەبێ. ئەمە ئەو خاڵە دەبێ تیایدا ڕژێم بەرامبەر بەو ڕیفۆرمانە بەرگری لە خۆی دەکا ـ لەپێناوی مانەوەی خۆیدا دەبێ بەرگری لە خۆی بکا، ئەوکات ئەم پرسیارە دێتەگۆڕێ. ئایا شۆڕش شتێکی مومکینە؟

پ/

**کۆمەڵگای ئازادی پاش شۆڕش چۆن ڕێك دەخرێو بەڕێوە دەبرێ؟ ئایا دەتوانرێ کۆمەڵگای ئاڵۆزی وڵاتە پیشەسازییەکانی خۆرئاوا بۆ نموونە لەسەر بنەڕەتی سیستمێکی شووراییی دابمەزرێو لە هەمانکاتدا ڕێژەی (یا توانای برِی) بەرهەمهێنانو ستاندارده تەکنۆلۆژییەکانی بپارێزێ؟**

مارکۆز/

ئێمە ئەمڕۆ ناتوانین ئەوە دیاری بکەین کە کۆمەڵگای پاش شۆڕش چ شێوە ڕێکخستنێك بەخۆوە دەگرێ. ئەم پێشبینیکردنە کارێکی بێهودەیە. ئێمە ئەمڕۆ کەسانێکی ئازاد نین و وەکو کەسانێکی نائازاد هەڵبەتە ناتوانین لەپێشدا ئەوە دیاری بکەین کە مرۆڤە ئازادەکان چۆن (ژیان و کۆمەڵگای خۆیان) ڕێك دەخەن. هەڵبەتە دەتوانین بەشێوەیەك لە شێوەکان نەخشە بۆ هەندێ بنەمای سەرەکی بکێشین. (سیستمی شووراییی) چەمکێکە لەڕووی مێژووییەوە ئیشکالیەتی پێشداوەریی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، بەڵام بەڕای من بونیادی هزر شتێکە هێشتا بەها و گرنگی خۆی هەیە. وتم لە کۆمەڵگای ئازاددا

مرۆڤەکان خۆیان ژیانو بوونی خۆیان دیاری دەکەن، لە بنەماکانی ئەو ژیانە یەکەم ئەوەیە ئەوان دەبێ خۆیان ئەوە دیاری بکەن کاری لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە پێویست چۆن دابەش دەکرێو هەمان کار لە خزمەتی کام ئامانجانەدا بێت. دەشێ باشترین شێوازیش لەم ڕووەوە ئەوە بێ لە سەرەتادا ئەو بنەمایانە لە کۆبوونەوەی ناوچەیی، کۆمیتەکان، شووراکاندا هەرچیەك کە ئێوە ناوی لێ دەنێن، بخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوەو، ئیدی ئەوانە لە هەموو کەس باشتر دەزانن دەبێ لەپێشدا گرنگی بە چی بدرێ و کاری لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە پێویست دەبێ چۆن دابەش بکرێ.

پ/

**بەلام ئایا چ کەسێك زامنکەری ئەوەیە بە لەناوبردنی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری کۆمەڵگایەك دێتە ئاراوە تیایدا فەرد ئازاد دەبێو خودێیی خۆی تێدا بەدی دەهێنێ؟ بەهەرحاڵ ئەو کۆمەڵگا سۆسیالیستیانەی ئێستا هەن هیچیان لەم ڕووەوە دڵنیاییان پێ نەبەخشیوین.**

**مارکۆز/**

لەڕاستیدا هیچ زامنییەك بۆ ئەمە نییە. مێژوو کۆمپانیای بیمە نییە. نابێ چاوەڕای ئەو زامنکەرە بین. ئەوەی دەتوانین بیڵێین ئەوەیە بە لەناوبردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری هەرچۆنێك بێ زەمینەیەك دەڕەخسێ تیایدا کۆمەڵگایەکی ئازاد دەتوانێ نەشونما بکات.

پ/

**چەپی نوێ دەبێ پەیڕەوی لە چ کارێکی سیاسیی مەلموس بکات؟ ئایا ئێوە ئامۆژگاریيان دەکەن تا پەیڕەوی لە سیاسەتی هاوپەیمانی لەگەڵ هێزە ڕەخنەگرەکانی تردا کە مارکسیست نین، بکەن؟ بۆ نموونە لەگەڵ هێزە پەرلەمانییەکاندا؟**

**مارکۆز/**

بەپێی پلەی کامڵبوونی وڵاتە سەرمایەدارییەکان وەڵامی ئەم پرسیارە دەگۆڕێ. لە وڵاتێکدا دژایەتیی شۆڕش دەکرێ، ئەم سیاسەتی هاوپەیمانییە پێویستە، بەڵام دەشێ ئەم سیاسەتە بۆ چەپی نوێ سیاسەتێکی کاتی بێت نەك پرنسیپێکی سیاسی. بەتەنها سیاسەتێکی لەم جۆرەش دەتوانێ بەگوێرەی هەڵوێستی دیاریکراو ئامانجی دیاریکراو بپێکێت، وەکو خۆپیشاندان، هەڵبژاردنی ناوخۆو هتد... ئەگینا بەدەر لەمە، بە بڕوای من تەواوی یاخیبوونەکان ئەمڕۆ لە دەرەوەی پەرلەماندان.

پ/

**ئایا چەپی نوێ بۆی هەیە لە کاروبارەکانی دەرەوەی پەرلەماندا بەرامبەر بەرژێم هێز بەکاربێنێت؟**

**مارکۆز/**

من بڕوام وایە نابێ ئەم مەسەلەیە لە گفتوگۆیەکی گشتیدا باس بکرێ،

بەڵکو تەنها دەبێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا باس بکرێ کە خۆیان لەناو مەسەلەکەدان. ئەمە جگە لەوەی دەبێ بەپێی هەڵوێستە دیاریکراوەکان هۆیەکانیش دیاری بکرێن. بەشێوەیەکی گشتی دەربارەی مەسەلەی بەکارهێنانی هێزو توندوتیژی تەنها دەتوانم ئەوە دووبارە بکەمەوە کە پێشتر وتوومە، ئەویش ئەوەیە لە کۆمەڵگای هەنووکەدا توندوتیژی بەرادەیەکی زۆر دەزگایی کراوەو مەسەلە سەرەکیەکەش ئەوەیە توندوتیژی لەکێوە سەرچاوە دەگرێ. بەهەرحاڵ بەبڕوای من لە قۆناغی دژایەتیکردنی شۆڕشدا دەتوانین بڵێین سەرەتا توندوتیژی لە سیستمی کۆمەڵگاکەوە سەرهەڵ دەداو، هەر بۆیە گروپی ئۆپۆزسیۆنیش بەرامبەر بەو توندوتیژیە پەنا دەباتە بەر توندوتیژیی بەرگرییانە نەك شەڕەنگێزانە.

پ/

**دوا پرسیارم ئەوەیە: لەو کۆمەڵگای ئازادییەدا کە ئێوە باسی لێوەدەکەن، تێڕوانینێکی ئەنسرۆپۆلۆژیانەی نوێتان بۆ مرۆڤ بونیاد نەناوە؟ مرۆڤێك کە هەمیشە کردەوەی باش و هاوخەمی لێ دەوەشێتەوە؟**

**مارکۆز/**

نەخێر لەو بڕوایەدا نیم، بەلای منەوە ئەو مرۆڤەی وێنای دەکەم مرۆڤێك نییە هەمیشە کردەوەی باش و هاوخەمی لێ بوەشێتەوە، بەڵکو مرۆڤێکە بۆ یەکەم جار و دەشێ هەر بۆ یەکەمین جاریش بێ لە مێژوودا دەتوانێ بەڕاستی

کردەوەی باش بێ و هەستی هاوخەمی لابێت. بەبڕوای من لەسەر بنچینەی دەسکەوتەکانی کۆمەڵگای پیشەسازی لەتوانادا هەیە ئەو غەریزانەی لەپێناوی دەسەڵاتدا سەرکوت کرابوون، بەڕادەیەکی زۆر ئازاد بکرێن و لەسەر بناغەی ئەم غەریزە ئازادبووانە –بێگومان غەریزەکانی ژیان نەك غەریزەکانی وێرانکاری– دەتوانرێ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا هاوخەمی ببێتە حەقیقەتێك، چونکە غەریزەکانی ژیان پێچەوانەی غەریزەکانی شەڕەنگێزین و لەنێو خۆیاندا ئەو هەلومەرجانەیان هەڵگرتووە کە بۆ باشکردنی ژیان و بۆ سوودوەرگرتنی زیاتر لە ژیان پێویستن، ئەویش نەك لەسەر حسابی کەسانی دی، بەڵکو پێکەوەو لەگەڵیاندا.

# ڕەخنەو بەرنامە

## کارل پۆپەر: کۆمەڵگای نوێ

لە ساڵانی (1935 - 1936)دا بۆ یەکەم جار چووم بۆ بەریتانیا. لە نەمساوە هاتبووم. ئەو وڵاتەی دیکتاتۆریەتێکی مامناوەندی حوکمی دەکرد، بەڵام لەژێر هەڕەشەی هاوسێ ناسیونال سۆسیالیستەکەی خۆشیدا بوو. لە کەشوهەوای ئازادی بەریتانیادا دەمتوانی هەناسە بدەم. دەتوت پەنجەرەیان لەسەر ڕووم کردۆتەوە. ناوی (کۆمەڵگای کراوە)ش زادەی ئەم ئەزموونەیە.

خەسڵەتە دیارەکانی کۆمەڵگای کراوە چین؟

دەمەوێ دوو خاڵ دەستنیشان بکەم، یەکەم ئەوەیە لەم کۆمەڵگایەی لەمەڕ مندا لێکۆڵینەوە ئازادەو ئەم لێکۆڵینەوەیەش کاریگەریی لەسەر سیاسەت دەبێ. دووەمیش ئەوەیە دامەزراوەکان لەپێناوی بەرگریکردن لە ئازادی و بێدەرەتاناندا دادەمەزرێن.

سەرەتا لە خاڵی دووەمەوە دەست پێدەکەم، دەوڵەت لەرێی دەزگا حقوقی و کۆمەڵایەتیەکانییەوە هاووڵاتیەکانی لە ئازارچەشتن بە دەست توندوتیژیەوە

دەپارێزێت و دەوڵەت دەتوانێ هاوولاتیەکانی لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتی ئابووریش بپارێزێ. ئەم کارە لە ئێستاشدا ڕوودەدات و دەتوانرێ باشتر بکرێ. ئێمە دەبێ کۆمەڵێك دەزگای کۆمەڵایەتی دابمەزرێنین تا ئەو خەڵکانە لە دەسەڵاتداران بپارێزرێت کە لەڕووی ئابوورییەوە نەدارن. واتە کۆمەڵێك دەزگا بۆ پاراستنی مرۆڤەکان لە چەوساندنەوەی ئابووری، چونکە دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێ دەسەڵاتی ئابووری ڕکێف بکات. مارکسیستەکان ئەو ئیمکاناتە سیاسیانە، بەتایبەتی ئەوەی پێی دەڵێن (ئازادییەکی ڕووکەش)، بەکەم دەزانن.

کەواتە من جەخت لەسەر گرنگیی سەرەکیی ڕۆڵی دەزگا سیاسیەکان لە ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتیدا دەکەم. ئەوەی گرنگە ئەوە نییە کێ حوکم دەکات، بەڵکو ئەوەیە چۆن حوکمڕانەکان لەیەکتر جیا دەکەنەوە.

بەمجۆرە دەچمەوە سەر خاڵی یەکەم، واتە گرنگیی لێکۆڵینەوەی ئازادو ئاشکرا. لەناو ئەو وڵاتانەدا کە کەم تا زۆر سیستمێکی کۆمەڵایەتیی کراوەیان تێدایە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەموویان گرنگترە. چارەنووسی هەموو کۆمەڵگا کراوەکانی دی بە چارەنووسی ئەوەوە بەستراوەتەوە. سەد ساڵێك بەسەر ئازادیی کۆیلەکان لە ئەمریکا و جەنگی ناوخۆی خوێنینی پێنج ساڵەی نێوان باکوور و باشووردا تێپەڕیوە. ئەمە بۆ ئەمریکا قەیرانێکی مەترسیدار و، قەیرانێکی ویژدانی بوو، ئێستاش ئەمریکا لە قەیرانێکی

ویژدانیی لەو چەشنەدا دەژی، هەم لەبەر مەسەلەی ڕەشپێستەکان و هەم لەبەر ڤیەتنام.

لێرەدا زۆر بەڕوونی ئەوە دەبینین بۆ کراوەبوونی کۆمەڵگایەك گرنگترین شت چییە؟ ئازادیی بیروڕا، بوونی گروپی بەرهەڵستکار گەورەترین ڕۆژنامەکان، بەتواناترین شیکەرەوەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ بەتوندی دژ بە دەوڵەت دەوەستنەوە. بەرهەڵستکاران خوازیاری ئەوەن هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لە ڤیەتنام بکشێنەوەو حکومەتیش لەژێر کاریگەریی ئەواندا ئەوەی وەکو بەرنامەیەك قبووڵ کردووە. ئێمە لێرەدا لەبەردەم حاڵەتێکی دەگمەنداین کە بەتەنها لە کۆمەڵگایەکی کراوە دەوەشێتەوە.

پاش چەند ساڵێك لە جەنگ، حکومەت لەژێر کاریگەریی لێکۆڵینەوەی ئاشکراو ئازاددا ناچار دەبێ دان بەوەدا بنێ ئەو جەنگە هەڵەیەکی گەورە بووەو دەبێ هەرچی زووە کۆتایی پێ بهێنرێ.

شتێکی ئاشکرایە من نامەوێ لێرەدا دیموکراسیەتی ئەمریکا وەکو نموونەیەکی بەرز بخەمە ڕوو. ئەمریکا وڵاتێکە کاری توندوتیژی و خراپەکاری تیایدا گەلێ زۆرە. پاش کوشتنی سەرۆك کەنەدی، ئەمریکا بەشێوەیەکی سەیر

ی‌کە یـ وو سـ خ رگۆڕا. لەتیـ مووداوە بارودۆخەکە پڕ ل

# پاشبەند

1-هێربرت مارکۆز و کارل پۆپەر (دوو گەورە پیاوی پیری دوو بزاوتی گەورەی فەلسەفیی ئەم سەردەمەی ئێمە)، کە گۆڕینی کۆمەڵگایان کردووە بە ئامانج زۆر پەلەو سەرپێیانە نەبێ یەکتریان نەدیوە و، هەرگیز لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆی جیددیان نەکردووە و، لەوەش ناچێت بیکەن. لەگەڵ ئەمەشدا ڕووبەڕووکردنەوەیان شتێکی پێویستە. بەتەنها ئەو تیۆرە کۆمەڵایەتییە دەکرێ تیۆرییەکی بەڕاستی ڕەخنەگرانە بێ کە گرنگی بە ناکۆکیەکانی نێوان سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕانەو ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی دەدات کە گۆڕانکاریی لەبەرچاو گرتووە.

ڕادیۆی باڤاریا هەوڵیداوە ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەی نێوان مارکۆز و پۆپەر -کە ڕووی نەداوە- لەڕێی تەلەفزیۆنەوە ئەنجام بدا. نووسەری ئەم چەند دێڕە بەشێوەیەکی جیاواز لە شوێنی نیشتەجێبوونیاندا پرسیاری ئاراستەی ئەم دوو

فەیلەسوفە کردووە و، پاشان وەڵامەکانیانی بەرامبەر یەك داناوە. قایلبوونی تەواوەتی مارکۆز بۆ بەشداربوون لەم بەرنامەیەدا ئاسان نەبوو.

گفتوگۆی سەرەتاییمان وەختێ کە لە ئەڵمانیا بوو، هەروەها پاشتریش نیو دەرزەن نامە کە لە میونیخەوە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونیم نارد لە (لاجۆلا) کە سەر بە ساندیاگۆی کالیفۆرنیایە، بوونە هۆی ئەوەی فەیلەسووفی (72) ساڵە قایل بێ ژییننامەو فەلسەفەی سیاسیی خۆی بخاتە ڕوو. کاتێکیش ستافە تەلەفزیۆنییەکە سەرەنجام لە نۆڤەمبەری (1969)دا چوون بۆ دیداری مارکۆز لە خانووە دارینە سادەکەیدا و لە نزیك زانکۆ دێرینەکەی ئەوەوە، کە دەکەوێتە سەر بەرزایی کەنارە بەردەڵانەکەی ئۆقیانووسی ئارام، ئەو خۆی وەك هاوڕێیەك و هۆگرێك و مامۆستای سوودوەرگر لەم دەزگای ڕاگەیاندنە پیشان داوە.

کارل ڕایمۆند پۆپەریش —کە وەکو هاوتا نیومارکسیستەکەی لە ساڵی (1969)وە خانەنشین بووە - بێ دواخستن پێشنیازەکەی قبووڵ کرد. ئەم زانایەش لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە گۆشەگیرییەکدا لە (پێن_penn )ی سەربەشاری باکینگهامشایری بەریتانیادا دەژین. پۆپەر چوار ساڵ لە مارکۆز بچووکترە، بەڵام چونکە ساغ و لەشدروست نییە، پێدەچێ تەلەفزیۆن و هونەرکارییەکانی ئازاری هەستیاندا بێت.

لە کاتێکا لە سەرەتاکانی دەهەی شەستدا ناوبانگی مارکۆز وەکو تیۆریسنی بزاڤی نێودەوڵەتی (چەپی نوێ) بە جیهاندا بڵاوبۆوە، کارڵ پۆپەر لە

دەرەوەی کەشوهەوای ئەکادیمیکدا زۆر نەناسراو بوو، وێڕای ئەوەی (سێرکارڵ پۆپەر) لە ساڵی (1965)دا نازناوی لۆردی وەرگرت. ڕەنگە کاریگەرترین فەیلەسووفی بواری ڕۆشنبیریی ئەنگلۆساکسۆنی و ئەسکەندیناڤی بێ. لە ئەڵمانیای فیدراڵدا، تەنانەت لەنێو خوێندکارەکانیشدا، پاش گفتوگۆیەك کە لە ساڵی (1961)دا لە شاری توبینگن لەگەڵ تیۆدۆر ئادۆرنۆدا ئەنجامی دا ناسرا. ئەو گفتوگۆیەی ئەو تیایدا بۆ جارێکی دیکە (ململانێی قوتابخانەی پۆزیتیڤیزم)ی لە سۆسیۆلۆژیای ئەڵمانیدا وروژاندەوە. هەڵبەت شتێك بوو لەجێی خۆیدا نەبوو، کە لەوەودوا پەیڕەویکارانی دیالەکتیك لە (قوتابخانەی فرانکفۆرت) مۆرکی لایەنگری لە پۆزیتیڤیزمیان لە نێوچەوانیدا. پۆپەر خۆی وەك تیۆریسنێکی زانستی، توندترین و وردبینانەترین ڕەخنەی ئاراستەی لایەنگرانی قوتابخانەی پۆزیتیڤیزمی نوێ کردووە کە لە دەوری (ڕۆدۆڵف کارناپ) و مەڵبەندی ڤیەننا کۆببوونەوە.

2- ئازادیی زیاتر، عەدالەتی زیاتر، ئینسانییەتی زیاتر بۆ کۆمەڵگاکانی سەر ڕووی زەوی، بابەتی ئەم دوو فەیلەسووفە بوون.

کاتێ مرۆڤ دوو تێزی ناکۆك لەگەڵ یەکدا هەڵدەسەنگێنێت، سەرەتا بە ناسینی کۆمەڵگای هەنووکەیی ئاشنا دەبێ" چۆنێتی شیکردنەوەی ئەو کۆمەڵگایە.

هێربرت مارکۆز کە چیدی وەکو مارکسیزمی تەقلیدی لە ئابووریی سیاسی و باری چینایەتی ئەم کۆمەڵگایانەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو لە ڕۆشنبیریی هوشیارانە و غەریزیانەی (مرۆڤی تاکڕەهەند)ەوە، وێنەیەکی ترسناکمان بۆ دەکێشێ.

بەڵام ئایا کۆمەڵگای ئێمە هەر بەڕاستی هێندە سەرکوتکەرە وەکو ئەم مارکسیستە نوێیە دەڵێ؟ ئەوە بەلای مارکۆزەوە گرنگ نییە و ڕەخنەیەك نییە زۆربەی کەسەکان هەست ناکەن بارەکە بەو جۆرە بێ. مارکۆز دەڵێ کامڵبوونی تۆفانئاسای تەکنیك و بەپیت و فەڕی و لەگەڵیشیدا باشبوونی ئاستی گوزەرانی تەنانەت هەژارانیش، نیشانە لاوەکییە دڕندانەکەی سەرمایەداریی ئەم چەرخە لەناوەوەو دەرەوەماندا دادەپۆشێ و، کەسەکان بەڕادەیەك گێژ و وڕ دەکات کە چیدی ناتوانن بە هەلومەرجی ڕاستەقینەی خۆیان بگەن. مرۆڤ با لەگەڵ ئەم پرنسیپەشدا بێ، بەڵام ناتوانێ ئەم پرسیارە نەکات:

مارکۆز ئەو پێودانگانە لەکوێوە دێنێ کە هۆشیاریی(ڕاستەقینە) لە هۆشیاریی (درۆزنانە)جیادەکەنەوە؟

بەڵام تەنانەت گەر ڕەخنە توندو وێرانکەرەکانی مارکۆزیش هەندێ جار بیانووی هەبێ، وا لە مرۆڤ دەکات بەرامبەر ئەو وێنە تاڕادەیەك گەشبینەی پۆپەر سەبارەت بە کۆمەڵگا دەیدا بەدەستەوە، ڕەشبین بێ. گەرچی پۆپەر ئەو ناعەدالەتی و پاشکۆیەتیە دەبینێ کە هێشتا لەم کۆمەڵگایەدا هەیە"بەڵام

ئەو باوەڕی وایە دیموکراسیەتی پەرلەمانی سەرەنجام لەتوانایدا دەبێ کە لەڕێی دامودەزگا دەوڵەتی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەرامبەر بە ئەندامە بەهێز و دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگا بەرگری لە ئەندامە بێدەرەتانەکان بکات.

خاڵی دووەم لە تێزەکانی ئەم دوو فەیلەسوفەدا، ئامانجی ئەو کۆمەڵگایەیە کە جێی مەبەستە و ڕێگاکانی گەیشتن بەو کۆمەڵگایە. بەلای مارکۆزەوە گومانێك لەوەدا نییە (کۆمەڵگای نوێ)ی ئەو سۆسیالیستی دەبێ و ڕێگاکانی گەیشتنیش پێی تەنها دەبێ لەڕێی لەناوبردنی ڕژێمی سەرمایەدارییەوە بێ، بەڵام بەجیا لە مارکسیزمی تەقلیدی، مارکۆز لە پێشدا خوازیاری گۆڕینی ڕیشەییانەی هوشیاری، واتە (سەرخان)ە، تا دواتر گۆڕینی شۆڕشگێڕانەی (بناغە) ئابوورییەکە ڕوو بدات. دەتوانین بڵێین ئەمە سۆسیالیزمێکە لەسەر بناغەی بایۆلۆژیا: کارڵ مارکسی دەوڵەمەند کراوە بە سیگمۆند فرۆید.

ئەوەی مارکۆز خوازیارە بەدی بێت، بیناکردنی مرۆڤێکی نوێیە" مرۆڤێك کە ویست و مەیلەکانی خۆی دەهێنێتە دی، مرۆڤێك کە هزری مەرگباری کێبڕکێی سەرمایەداری ناناسێت، مەیلی شەڕەنگێزیی تێدا نەماوەو لەبری ئەوە ڕەفتارێکی هاوخەمانەی هەیە، مرۆڤێك بەقووڵی نەفرەت لە جەنگ دەکات. ئەمە یۆتۆپیایەکە وێنەیەکی فریودەری هەیە، بەجۆرێك مرۆڤ تەسلیمی دەبێ.

بەڵام کۆمەڵێك پرسیاریش دەمێننەوە: لە هەلومەرجەکانی ئابووریی پیشەسازیدا کۆمەڵگا دەبێ چۆن چۆنی ڕێك بخرێ؟

ئەگەر هوشیاریی مرۆڤ بکەوێتە بەر کاریگەریی شۆڕشی بەردەوامەوە" ئایا بە سیاسیبوونی هەموو پەیوەندییە مرۆییەکانی بەدوادا نایەت، کە نزیکەی تەواوی کەشوهەوای ئازادی لە تاك زەوت دەکا؟ ئەو کات، دەتوانین تاڕادەیەك دڵنیا بین کە شۆڕشەکەی مارکۆز نابێتە مایەی پەیدابوونی دیکتاتۆرییەتێك کە ئەو خۆی خوازیاری نەبووە؟ مارکۆزی مارکسیستی نوێ دەڵێ: (لەم ڕووەوە هیچ گرنتیەك نییە.مێژوو کۆمپانیای بیمە نییە). ڕێك کاتێك کۆمەڵگای هەنووکەییشمان بۆ دیاری دەکاو (کۆمەڵگای نوێ)مان بۆ پێشنیاز دەکا دەتوانین بپرسین" کام پێوەرانە بەڵگەی (دروستی)ی ئەو کۆمەڵگایەن و، مرۆڤ لەکوێوە ئەم پێوەرانە دەهێنێ؟ ئایا لێرەدا و لەدوا شیکردنەوەدا هەست ناکەین ڕیشەیەکی دۆگماتیکیانە خۆی حەشارداوە کە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بە دەستەبژێرەکان دەسپێرێ: (هزری ڕێنمایی دەستەبژێرەکان بۆ حەقیقەت، بۆ هەڵگرانی زانستی ئازادییەخش) (هانزئەلبێرت)؟

بەرامبەر بەوەش کارل ڕایمۆند پۆپەر زۆر دوورو بۆ دەرەوە ناڕوانێت تا بگاتە (یۆتۆپیا). ئامانجی ئەو (کۆمەڵگای کراوە) بەردەوامیپێدان و کامڵکردنی ئەو دیموکراسیەتە پەرلەمانییەیە لەئارادایە و ئەوەش لەڕێی ڕیفۆرمە کۆمەڵایەتیەکانەوە. بەلای ئەم لیبراڵە نوێیەوە هەر شۆڕشێك ئەو مەترسیەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە کە (شۆڕشەکە بکوژێ و ئامانجەکانیشی بفەوتێنێ)، بەڵام ئەگەر ڕیفۆرمەکان دەرەنجامی خراپیان لێکەوتەوە" دەتوانین چاکیان

بکەین. بێگومان پرسیارێك لێرەدا هەموو شتەکان دیاری دەکات ئەوەیە: گەر بێتو تاڕادەیەکیش وەسفی مارکۆز بۆ سەرمایەداریی هەنووکەیی ڕاست بێ" ئایا (کۆمەڵگای کراوە) قابیلی هاتنەدییە؟

جگە لەمە پۆپەر خوازیاری ئەوەیە ململانێ کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی ئەقلانی چارەسەر بکرێن، بەڵام ئایا دیاریکردنی بەهاکان و هەروەها هەڵوێستە سیاسیەکان لانی کەم ناکەونە ژێر کاریگەریی هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە باڵادەستەکانەوە؟ هەروەها (کۆمەڵگای کراوە)ی پۆپەر، کە ئەمیش خۆی لەخۆیدا شایانی سەرنجدانە، لەڕاستیدا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دیاری نەکراوە. پۆپەر ئەم دیموکراتە ئازادیخوازە، وێنەی کۆمەڵگایەکی (دروست)ی بەدەستەوە نەداوە. ئەو بەتەنها ڕێساکانی یارییەك دەدات بەدەستەوە کە دەبێ لە ڕووبەڕووبوونەوەکاندا ڕەچاو بکرێ و، گرنتیی کۆمەڵێك دەزگا پیشان دەدا کە دەبێ کاری تایبەتی خۆیان ئەنجام بدەن. ئەم مەسەلەیەش کە بە ڕەچاوکردنی یاسا بەدەستهێنراوەکان سەرەنجام دەبێ بەدوا کام ئامانجە سیاسیانەدا بڕۆین، دەبێ بەردەوام و سەرلەنوێ لەنێو تۆژینەوەی ڕەخنەگرانەدا نەشونوما بکات و (بەشێوەیەکی کاتی) سەقامگیر بێ.

بەڵام ئایا چۆن دەتوانین ئەم ڕێکەوتنە لە کۆمەڵگایەکدا وەچنگ بهێنین کە چەندین مەیل و بۆچوونی جیاوازی تێدایە؟ بێگومان لەڕێی بڕیارێکەوە کە زۆربە دەیدەن. لێرەدا بۆ جارێکی دی گومان لە سەربەخۆیی هوشیاریی

تاکەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریی هەنووکە دێتەگۆڕێ _گومانێک کە مارکۆز تۆوەکەی چاندووە. کە دەڵێین (کۆمەڵگای کراوە)ی پۆپەر لەدوا شیکردنەوەدا لەڕووی ناوەڕۆکەوە بە بۆشی دەمێنێتەوە، ئەمە ئەنجامێکی مەنتیقیی بنەما فەلسەفی *زانستی* تیۆرییەکەی ئەوە. لە کاتێکدا لای مارکۆز زانست بریتیە لە (شیکردنەوەی بۆچوونەکان و ئیمکانەتە مێژووییەکان و بەمجۆرە نەریتە کۆمەلآیەتیەکان، نرخاندنی بەها سیاسیەکان لەڕووی زانستییەوە قابیلی سەلماندن دەبن، دەبینین لای پۆپەر مەعریفەیەکی متمانە پێکراو، تەنانەت لە بواری زانستە سروشتیەکانیشدا نییە. مەعریفەی ئێمە مەزەنە (حدس)ێکی ڕەخنەگرانەیە. ئێمە بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان کۆمەڵێك تێزمان لەبەردەمدایە و، ئەرکی زاناش ئەوەیە بەردەوام هەوڵ بدات ئەم تێزانە ڕەت بکاتەوە. ئێمە پێمان خۆشە پشت بەو تێز و تیۆریانە ببەستین کە بەرامبەر بە هەوڵ و تەقەللای ئێمە بۆ ڕەتکردنەوەیان زیاتر لە تێزەکانی دی بەرگە دەگرن.

ئەم جۆرە تیۆرو تێزانە بە پێودانگی ڕەخنە دروستیی خۆیان سەلماندووە، سەرباری ئەمەش هەموو ساتێك قابیلی ئەوەن لەناو بچن و، ئێمەش نابێ لەم ڕووەوە دەستەوسان بین.

بەمجۆرە ئەسڵی ناکۆکیی نێوان مارکۆز و پۆپەر، نێوان فەیلەسووفی نیو مارکسیستو فەیلەسووفی کۆمەڵایەتیی ئازادیخواز یا (ئەقڵگەرای ڕەخنەگرانە)

هەروەکو پۆپەر ئەو ناوە لە خۆی دەنێ، لە تیۆری جیاوازیاندایە دەربارەی زانست و ئەو وێنە دژ بەیەکەی سەبارەت بە زانست و ئەرکەکانی زانست بۆ مرۆڤ دەیخەنە ڕوو.

3- وەکو مرۆڤێکی هاوچەرخ کە وردبوونەوە لە نائینسانیەتی سیستمی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەوی بەلای مارکسیزمدا بردووە، من وایدەبینم نەك هەر بەتەنها مارکۆز لەلایەن پۆپەرەوە قابیلی ڕەخنەلێگرتنە (بۆ نموونە لەڕێی تیۆرە زانستییە قەناعەتپێکەرەکەیەوە سەبارەت بە ئەقلانیەتی ڕەخنەگرانە)، بەڵکو پۆپەریش لەلایەن مارکۆزەوە قابیلی ڕەخنەلێگرتنە (لەڕێی وەسفکردنی وردو سەرنجڕاکێشی کۆمەڵگاکەمان و دیاریکردنی چارەی خۆنووسین و بەدیهێنانی خود لەم کۆمەڵگایەدا - هەرچەندە ئەم وەسفەش زێدەڕۆ بێ).

من لەوە دڵنیانیم بتوانرێ تێزێکی هاوبەش لەنێوان تێزە بەیەك ناکۆکەکانی مارکۆز و پۆپەردا دروست بکرێ، بەڵام بەبڕوای من تیۆرییەك کە ببێتە بناغەیەك بۆ کۆمەڵگایەکی ئازادتر و عادیلانەتر، پێویستە سوود لە بیروبۆچوونەکانی هەردوو ئەم فەیلەسووفە وەربگرێ. مەبەست لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەش ئەوەیە تێزە ناکۆکەکان لەڕووی تیۆرییەوە جیابکەینەوە، تا بەجۆرە هەندێ خاڵ بکەونە ڕوو کە ببنە سەرەتایەك بۆ بنیادنانی تێزێکی هاوبەش.

**میونیخ، مانگی مارتی 1971**
**فرانز شتارك**

## کتێبە چاپکراوەکانی ئازاد بەرزنجی

- ***تەرمی نەناسێک*** ( کورتە چیرۆک)

چاپی یەکەم 2004

- ***چاوەکانی*** (ڕۆمان)

**بوزورگی عەلەوی/ چاپی یەکەم (1997) چاپی حەوتەم 2007**

- ***جۆناسانی نەورەس*** (کورتە ڕۆمان)
- ڕیچارد باخ/ چ2 2002

- ***خەونێک لە وڵاتی پیاوە بچکۆلەکاندا***

(کورتە چیرۆکی جیهانی)1997

- ***بەناوی ژیانەوە*** (وتار و لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ)

ئەریک فرۆم –(چاپی یەکەم 1998)چاپی چوارەم 2008

- ***شۆڕش یا ڕیفۆرم***

(گفتوگۆ لەگەڵ مارکۆز و پۆپەر)دا 1998

- ***پیدرۆ پارامۆ*** (ڕۆمان)

خوان ڕۆلفۆ_(بەهاوکاری لەگەڵ ڕێبوار سیوەیلی) دا 1999

- ***چەند وێستگەیەکی فیکری و ئەدەبی***

(وتار و باسی فیکری و ئەدەبی) چ 1 200 چ 2. 2006

- ***تریفەی تەنیایی***

(ژیان و شیعری سوهراب سپهری)2000

- ***تورکیا لە سەردەمی گۆڕاندا***

محەمەد نورەدین 2001

- ***لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا***

(چەند گفتوگۆیەکی فەلسەفی و ئەدەبی) 2001

- ***نیچە***

پۆڵ ستراتێرن 2001

- ***ژنێ لەبەردەم وەرزێکی سارددا***

(ژیان و شیعری فروغ فەڕوخزاد) چ 2 2008

❖ 


پۆڵ ستراتێرن 2002

❖ **مۆدێرنەکا ن**

رامین جەهانبەگلو 2003

❖ **مارکۆز و پۆپەر**

( باس و گفتوگۆ) 2003

❖ **کیرکەگۆر**

پۆڵ ستراتێرن2003

- کازانتزاکیس

یۆرگۆس ستاسیناکیس 2004

❖ **دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن** (گفتوگۆی فەلسەفی و ئەدەبی)

(بەهاوکاری لەگەڵ ئاوات ئەحمەددا)2004

❖ **چاکە و خراپە**

کریشنا مورتی_2004

❖ ***ئاوریشم*** (ڕۆمان)

ئەلێساندرۆ باریکۆ چ 1 2004 چ 2 2007

❖ ***بەفر*** ( ڕۆمان)

ماکسێنس فێرمین 2004

- کەمانچە ڕەشەکە ( ڕۆمان )

ماکسێنس فێرمین 2005

- هەنگوین (ڕۆمان)

ماکسێنس فێرمین 2006

❖ ***نامەی منداڵان بۆ خوا***

ستیوارت هامپڵ و ئیریك مارشاڵ ***2005***

❖ ***فەلسەفەی بوونگەرایی***

***جۆن ماکواری، چاپی دووەم 2007***

**** لاپەڕە پەرشەکان***

***(چەند دەقێکی وەرگێڕراو و نووسراو) 2005***

* حیكایەتەكانی دوێنێ و ئەمڕۆ

پاولۆ كۆییلیۆ چ 1 2006

* مێژووی شارستانێتی (ب 1 چاپی كوردی ، بەهاوكاری لەگەڵ دانا ئەحمەد و نەبەز كەمالدا)

ویڵ دیورانت 2007

* سازی ئاسنین (شانۆنامە)

جۆزیف ئۆكۆنۆر 2007

* بەبێ خوێن (ڕۆمان)

ئەلێساندرۆ باریكۆ 2007

- نۆڤێچێنتۆی پیانۆژەن (یا ئەفسانەی 1900)

ئەلێساندرۆ باریكۆ 2008

**به عەرەبی:**

- ***مضيق الفراشات*** **(قصيدة طويلة للشاعر الكردى شيركو بيكه س)**
**ترجمة آزاد البرزنجي ط 1, دار الرازى –بيروت– لبنان.1996، ط2 السليمانية 2007 مؤسسة سردم للطباعة والنشر**
- ***عار تماماً كالماء*** **(مختارات شعرية لدلاوةر قرةداغى)**
**ترجمة آزاد البرزنجي, دار الطليعة الجديدة –سوريا – دمشق. 2000**
- ***سفِرالروائح*** **(قصيدة طويلة للشاعر شيركو بيكه س)**
**ترجمة آزاد البرزنجي, دار نينوى –دمشق –سوريا. 2001**